زنجیرە وتاری (شیرك و شیركی گوێڕایەڵی كردن)

# الشرك وشرك الطاعة




## لجنة كتابة الدستور أنداد لله تعالى

## لیژنەی نووسینەوەی دەستور
## هاوبەش بڕیاردراوانێكن بۆ الله تعالى

وتاری شیخ
تقبله الله
أبو علي الأنباري

وەرگێڕانی
پێگەی ڕاستەڕێ

پێشكەش كراوە
لە ڕۆژی دووشەممە ١٠ - موحەڕەم - ١٤٣٥ لە بەرامبەر ٣-١١-٢٠١٤



لە وتارێکانی
شێخ ئەبی عەلی ئەنباری - تقبه اللّٰه-

بەناونیشانی
لیژنەی نووسینەوەی دەستور هاوبەش بڕیاردراوانێکن بۆ اللّٰه تعالی

وەرگێڕانی
پێگەی ڕاستەڕێ

پێشکەش کراوە
لە ڕۆژی دووشەممە ١٠ - موحەڕەم - ١٤٣٥ لە بەرامبەر ٣-١١-٢٠١٤

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله

پەروەردگارا حەقمان بە حەق پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر شوێنکەوتنی، وە باتڵیشیمان بە باتڵ پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر ئەوەی لێی دووربکەوینەوە، پەروەردگارا ئەوەمان فێر بکە کە سوودمان پێدەگەیەنێت و سوودبەخشمان بکە بەوەی فێرمان دەکەیت، پەروەردگارا لەوانەمان بکەیت کە کار دەکەن بە زانستەکەیان ئەی پەروەردگار زانستەکەمان بکە بە بەڵگە و حوجحە بۆمان ئەو ڕۆژەی بە دیدارت دەگەین و نەیکەیتە حوجحە بەسەرمانەوە ئەی چاکترینی بە بەزەییان، ئەی پەروەردگارم سینەم ئاسوودە و گوشاد بکە و کاروبار و هەوڵ و کۆششم بۆ ئاسان بکە و گرێی زمانم بکەرەوە و زمانم گۆیا و پاراو بکە تا لە قسە و گوفتارم تێبگەن، پەروەردگارا کردەوەکانم چاك بکە و تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆ بێت و هیچ بەشێکی تێدا نەبێت بۆ هیچ یەکێك لە دروستکراوانت.

بە فەزڵ و یارمەتی الله تەواو بووین لە باسی شیرکی گوێڕایەڵی کردن، وە باسی بەڵگەکانمان کرد لەسەر ئەم جۆرەی شیرك، هەروەك وتمان هەر کەسێك پەسەندی ئەوە بکات کە حوکم بکرێت بەم قانونە دەستکردانە یان پێیان ڕازی بێت ئەوا شیرکی بۆ الله عز وجل بڕیار داوە و جۆری شیرکەکەش بریتییە لە شیرکی گوێڕایەڵی کردن.

ئەمڕۆش -بە ئیزنی الله تعالی-

باسی لیژنەی نووسینەوەی دەستور دەکەین، جا پشتبەستوو بە الله عز وجل دەڵێم: شتەکە نامۆ و شاراوە نیە، هەروەك دەزانن وڵاتانی ئیسلام حوکمی دەکرا لە لایەن دەسەڵاتدارانێك کە ڕۆژئاوا پێیان دەڵێن دیکتاتۆرەکان: کە بریتیین لەوانەی بە تاك لایەنە حوکم دەکەن، پاشان دوای ئەوە ئاژاوە و ژاوە ژاو ڕوویدا و خەڵکانێك توانیان ئەم دەسەڵاتدارانە لابەرن، وە پێکهێنانی حیزبەکان دەستی پێکرد، جا ئەوانەی حیزبەکانیان پێکهێنا دەستیان کرد بە بانگەشەکردن بۆ دیموکراسی و لە چوارچێوەی ئەو شتانەی بانگەشەیان بۆ دەکرد -لەسەر ئەوەی گۆڕانکاری دەکرێت لەناو دەسەڵاتەکە و لەناو حوکمەکانیش- بانگەوازیان کرد بۆ پێکهێنانی لیژنەیەك بۆ نووسینەوەی دەستور سەر لەنوێ، جا لە عێراق لیژنەی نووسینەوەی دەستور، و لە میصر لیژنەی نووسینەوەی دەستور، و لە تونس لیژنەی نووسینەوەی دەستور، و لە لیبیا و بە هەمان شێوە لە هەر وڵاتێك لەم وڵاتانەی ئەم ڕووداوانەی تیادا ڕوویاندا، کاردەکەن لەسەر پێکهێنانی لیژنەی نووسینەوەی دەستور، ئایا حەقیقەتی ئەم لیژنەیە چییە ؟ وە حوکمی شەرع دەربارەی چییە ؟ ئەم لیژنانە بە هاوبەشانێك بۆ الله عز وجل لە قەڵەم دەدرێن(لجنة كتابة الدستور أنداد لله تعالى )، هەر لیژنەیەك پێکهاتبێت بۆ نووسینەوەی

دەستور، ئەوا حوکمی شەرعی لە دەربارەی ئەم لیژنەیە ئەوەیە کە هاوبەشانێکن بۆ الله عز وجل، وە واتای (النِّد) هەروەك لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا هاتووە بریتییە لە "هاوتا و هاووێنە و هاوچەشن"، وە لە (ابن مسعود -رضي الله عنه-)ـەوە هاتووە کە بە واتای "هاووێنە" دێت، هەروەك ئیمامی (الماوردي -رحمه الله تعالى-) لە تەفسیرەکەیدا باسی کردووە، وە بە هەمان شێوە ئیمامی (الماوردي) لە (ابن عباس -رضي الله عنهما-) ـەوە کە وتویەتی: (الند: بریتییە لە هاووێنە و لێکچوو)، وە خاوەنی پەڕتوکی (العين)، الخليل بن أحمد الفراهيدي، باسی ئەوەی کردووە کە ئەوەی هاووێنەی شتێك بێت ئەوا دژیەتی، "النّد: دژی هاووێنەکەیە")، بە هەمان شێوە لە [تاج العروس]دا هاتووە (کە النّد بە کاری -ئەسڵەکە- هەڵدەستێت و بە هەمان شێوە الند هەمیشە پێچەوانە و دژی ئەسڵەکەیە)، ئەمە لە زمانی عەرەب و ئەمەش واتای النِّد، واتە دەبێتە لێکچووی ئەو و دەبێتە هاووێنەی، وە دژی ئەسڵەکەیە و پێچەوانەیەتی ئەگەرنا (النِّدية) چۆن دەردەکەوێت ئەگەر پێچەوانە و دژی ئەسڵ نەبێت ؟ ئەمە واتای (النّدية)، سەبارەت بە بەڵگە لەسەر ئەوەی لیژنەی نووسینەوەی دەستور هاوبەشانێکن بۆ الله تعالی، هەروەك لەم وتەیەی الله تعالى دا هاتووە لە سوڕەتی (یوسف)، الله عز وجل دەفەرموێت: ﴿ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾[1]، واتە: (گشت حوکم و بڕیارێك تەنها و تەنها هی خوایە، فەرمانیداوە کە ئێوە دەبێ تەنها ئەو بپەرستن و گوێڕایەڵی هەر لەو بکەن).

چۆن ئەم ئایەتە دەکەیتە بەڵگە لەسەر ئەوەی لیژنەی نووسینەوەی دەستور هاوبەشانێکن بۆ الله عز وجل، واتە خۆیان کردووە بە خوا ؟!، سەرەتا ئایەتەکە دەستی پێکردووە بە (**إن الحُكم**) پاشان دوای ئەوە (**إلا لله**)، زانایانی زمانی عەرەبی دەڵێن ئەگەر (إن) ئامرازێکی جیاکردنەوەی لەدوا هات ئەوا (إن) بە واتای (ما)ـی نەریَ کردن دێت بەمەش ئایەتەکە دەبێتە (ما الحكم إلا لله)، ئەمەیە کە لە ئایەتەکە تێدەگەین لە سەرەتادا، وە کاتێك الله دانانی حوکمەکان لە کەسانی تر ڕەت دەکاتەوە، ئەوا ئامرازی جیاکردنەوە (إلا) دێت و بەدوایدا وشەی جەلەلات (الله) دێت، کەواتە هیچ کەسێك بۆی نیە حوکم دابنێت بۆ ئینسان جگە لە الله عز وجل، وە دوای جیاکردنەوەکە بە تەنها ناوی الله هاتووە، ئەمەش تایبەتمەندیێکە لە تایبەتمەندیەکانی الله تعالى کە مەبەستم تایبەتمەندییتی دانانی حوکمەکانە، چونکە الله عز وجل دوای ئامرازی جیاکردنەوەکە باسی هیچی نەکردووە تەنها وشەی جەلالەت نەبێت (**إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ**)، واتە هەر تەنها الله عز وجل تەشریعەکان دادەنێت و حوکمەکان دادەنێت.

[1] [یوسف: ٤٠]

بەڵگە چییە لەسەر ئەوەی کە الله عز وجل تاك لایەنی بۆ هەیە لە دانانی حوکمەکان، چۆن دەیسەلمێنیت کە دانانی حوکمەکان تایبەتمەندییەکە لە تایبەتمەندیەکانی الله عز وجل ؟

بەڵگەی یەکەم: ئەوەی باسم کرد لە ئایەتە پیرۆزەکە (**إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ**) .. لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە شتێك بکەم، نەریٚ کردنەکە ئەگەر بەدوایدا ئامرازێکی جیاکردنەوە هات، ئەمە لە زمانی عەرەبیدا بە "الحصر" ناسراوە، وە بەرزترین پلەی (الحصر) ئەوەیە کە ڕستەکە نەریٚ بێت و دوای نەرێیەکەش ئامرازی جیاکردنەوە بێت، واتە دانانی حوکمەکان تەنها تایبەتە بە الله عز وجل چونکە ئەمە یەکێکە لە شێوازەکانی دیاریکردن (الحصر) لە زمانی عەرەبدا سەبارەت بە شێوازەکانی تریش، شێوازی دووەم بریتییە لەوەی ئامرازی الحصر (إنّما) بەکاربهێنرێت، **قَالَ تَعَالَىٰ**:﴿ **وَمَن يَكۡسِبۡ إِثۡمٗا فَإِنَّمَا يَكۡسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ١١١** ﴾[٢]، واتە لەو تێپەڕ ناکات، تایبەتە بەو، لەودا کورت کراوەتەوە، هەروەها شێوازی سێیەم لە شێوازەکانی (الحصر) لە زمانی عەرەبیدا: پێشخستنی ئەوەی کە پێویستە دوابخرێت، هەروەك لەم وتەیەی الله تعالی هاتووە (**إياك نعبدُ**) هەروەك دەزانیت کە جێناو دوا دەخرێت جا هەتا پێگەکەی دواخستن بێت و پاشانیش پێشبخرێت، ئەوا ئەمە مانای (الحصر) دەدات، واتە ئێمە هیچ کەسێك و شتێك ناپەرستین جگە لە الله عز وجل، چۆن تێگەیشتم لە کورت کردنەوەی بەندایەتی و پەرستن بۆ الله تعالی ؟، چونکە ئەوەی پێویستە دوابخرێت، پێشخراوە (**إيّاك نعبدُ**) وە ئەسڵەکەش (نعبدُ إيّاك)ـیە، کەوابوو لەم ئایەتەدا (**إن الحُكم إلا لله**) بەرزترین پلەی (الحصر)ـە لە زمانی عەرەبیدا، بۆیە الله تعالی لەم ئایەتەدا دانانی حوکمەکانی تایبەت کردووە بە زاتی بەرز و بڵندی خۆی، کەوابوو ئەمە بەڵگەی یەکەمە (**إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ**) لەسەر ئەوەی دانانی حوکمەکان لە تایبەتمەندیێتی الله تعالی ـیە.

بەڵگەی تر، هەندێك ئایەتی تر هەیە دەیسەلمێنێت کە الله تعالی بە تەنها حوکم دەردەکات هەروەك لەم وتەیەی لە سوڕەتی (الشوری) هاتووە:**قَالَ تَعَالَىٰ**:﴿ **وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۚ ١٠** ﴾واتە: (لە هەر شتێکدا کێشە و ڕای جیاوازتان بوو، دەبێ حوکمەکەی بگێڕدرێتەوە بۆ لای الله ).

بۆیە هیچ کەسێك بۆی نیە حوکم بدات لەسەر جیاوازی و ناکۆکیەکان جگە لە الله عز وجل (**وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ**) وە وشەی (**شَيۡءٖ**) هەموو شتەکان دەگرێتەوە، بە بچووك و گەورەیەوە و بە دیار و وردیەوە، کەوایە (**وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ**) حوکمەکەی بۆ لای الله

٢ [النساء: ١١١]

دەگەڕێنرێتەوە نەك بۆ لای جگە لە الله، ئەمە لە سورەتی (الشورى)، هەروەها لە سورەتی (الأنعام) الله تعالى دەفەرموێت:﴿ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا ﴿١١٤﴾ ﴾(پێیان بڵێ: ئاخۆ ڕەوایە جگە لە خوای بەدەسەڵات کەسی تر بکەمە دادوەری نێوانمان) . کەواتە هیچ دادوەر و حەکەمێك نیە جگە لە الله عز وجل، هەروەها لە سورەتی (الكهف)، الله تعالى دەفەرموێت:﴿ وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ ﴾ واتە:(وخوایش لە کار و بڕیاری خۆیدا هیچ کەسی نەکردووە بە هاوتا و هاوبەشی خۆی، بێ شەریك و بێ هاوتایە). کەوابوو ئێستا دوو بەڵگەم لەبەردەستە، بەڵگەی یەکەم: (إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ)، بەڵگەی دووەم لەسەر ئەوەی دانانی حوکمەکان لە تایبەتمەندییێتی الله ـيە -عز وجل- ئەم سێ ئایەتە بوو کە باسم کرد.

بەڵگەی سێیەم لەسەر ئەوەی کە دانانی حوکمەکان لە تایبەتمەندییێتی الله ـيە -عز وجل-، ئەگەر ورد بیتەوە و سەرنج بدەیت لە ئایەتی (إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ) پرسیارێك دێتە پێش "ئایا پێغەمبەرﷺ تەشریعەکان دادەنێت وەك گەیاندنێك لە الله عز وجل ـەوە یاخود نا ؟ بەدڵنیاییەوە دادەنێت، جا کەوایە بۆچی ناوی نەهێنراوە لەگەڵ ناوی الله لەم ئایەتەدا ؟ بۆچی الله عز وجل نەیفەرموو "إن الحكم إلا لله ورسوله"، وەك ئاشکرایە ناوی پێغەمبەر ﷺ لە جگە لەم جێگەیە هاتووە لە ئایەتی تردا، هەروەك لە سورەتی (النّور)، الله تعالى دەفەرموێت: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ... ﴿٦٢﴾ ﴾ واتە: (بەڕاستی ئیمانداران ئەوانەن کە باوەڕیان هێناوە بە الله و پێغەمبەرەکەی و هەر کاتێك کۆ دەبنەوە لە خزمەتیدا بۆ کارێکی گرنگ و پێویست کە هاوکاریی دەوێت، ناڕۆن و (خۆیان نادزنەوە) هەتا مۆڵەت نەخوازن).

کەوابوو لە پایە وباسی ئیمان، لە پاڵ ناوی الله دا ناوی پێغەمبەر ﷺ هێنراوە (إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ) ئەمە لە پایە و باسی ئیمان، سەبارەت بە پایەی گوێڕایەڵی کردن هەروەك لە سورەتی (آل عمران) هاتووە،﴿ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٣٢﴾ ﴾ واتە: (گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری الله و پێغەمبەرەکەی بن بۆ ئەوەی ڕەحمتان پێ بکرێت).

ناوی پێغەمبەر ﷺ لە پایە و باسی گوێڕایەڵی کردن لکاوە بە ناوی الله تعالى، بەڵام کاتێك دێینە سەر ئایەتی حوکم، دەبینین کە الله تعالى تەنها ناوی بەرز و پیرۆزی خۆی هێناوە و ناوی خۆی نەلکاندووە بە ناوی پێغەمبەر ﷺ

چۆن دەیسەلمێنیت کە پێغەمبەر ﷺ تەشریع دادەنێت و لەگەڵ ئەمەشدا ناوی نەهێنراوە لەم ئایەتەدا ؟

بەڵگەکان لەسەر ئەمە هەروەك لە سوڕەتی (الأعراف) هاتووە، الله تعالی لە دەربارەی جوولەکە و نەساڕا دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٥٧﴾﴾ واتە: ئەوانەی کە شوێنی ئەم (محمد ﷺ) پێغەمبەرە هەواڵدەرە نەخوێندەوارە دەکەون ئەوەی کە (گاور و جوو، ناو ونیشانیان) دەستیان دەکەوێت نووسراوە لای ئەوان لە تەوڕات و ئینجیلدا، فەرمانیان پێدەدات بەچاکە و قەدەغەی گوناهـ وخراپەیان لێدەکات و هەرچیەك پاك و چاكە بۆیان حەڵاڵ دەکات و هەرچی پیس و ناپوختە لێیان حەڕام دەکات و ئەرکە قوڕس و سەنگینەکان لەسەر شانیان لادەبات، ئەو کۆت و زنجیرانەش کە لەسەریان بوو لای دەبات، جا ئەوانەی باوەڕیان پێ هێناوە و پشتیوانیان لێکردووە و پشتگیریان کردووە و شوێنی ئەو نوورە کەوتوون (کە قورئانە) و هاوڕێ لەگەڵیدا ڕەوانە کراوە، هەر ئەوانە سەرفراز و ڕزگارن.

کەواتە لە سیفەتەکانی پێغەمبەر ﷺ لە تەورات و لە سیفەتەکانی ئەو لە ئینجیلدا ئەوەیە کە حەڵاڵ بۆ ئوممەتەکەی حەڵاڵ دەکات و پیسەکانیان لێ حەڕام دەکات، ئەمە تەشریعە، باشە، بەڵگە چییە لەسەر ئەم تەشریعە ؟ واتە چۆن دەیسەلمێنیت کە پێغەمبەر ﷺ جیا لە قورئان حەڵاڵ دەکات و حەڕامیش دەکات، بەڵگەی یەکەم، ئەم وتەیەی الله تعالی: ﴿حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ وَٱلدَّمُ... ﴿٣﴾﴾[3]، ئەمە لە پەڕتوکی پەروەردگارمان، بەڵام لە ڕێباز و سوننەتی پێغەمبەرمان ﷺ ، فەرموودەکە بەم شێوەیەیە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (أُحلَّت لنا ميتتان و دَمان، الميتتان الحوت والجراد ، والدمان الكبدُ والطحال )[4] ، واتاکەی: (بۆمان حەڵاڵ کراوە دوو مردارەوە بوو و دوو خوێن، دوو مردارەوە بووەکە بریتیین لە ماسی و کوللـە، وە دوو خوێنەکەش بریتیین لە جگەر و سپڵ).

کەوابوو الله عز وجل دەفەرموێت: ( حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ وَٱلدَّمُ ) ئەمە تەشریعێکە لە پەڕتوکی پەروەردگارمان، بەڵام لە سوننەتی پێغەمبەرمان، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (دوو مردارەوە بوومان بۆ حەڵاڵ کراوە کە {الحوت} "بە واتای ماسی و {الجراد}ـیش هەروەك ناسراو و ئاشکرایە، وە دوو خوێنەکەش بریتیین لە جگەر و سپڵ)، ئیمامی صەنعانی -رحمە الله- لە (سُبل السلام)دا، لە دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێت بە دروستی مەوقوفە لەسەر

[3] [المائدة: ٣]

[4] فەرموودەکە (ابن ماجە والدارقطني والبيهقي) گێڕاویەتیانەوە ڕەحمەتی الله تعالی لە هەموویان بێت

صەحابیەکە، واتە ئەمە وتەی صەحابیێکە، بەڵام هەروەك دەزانیت -وە ئیمامی صەنعانی ئەمە دەڵێت- کە نموونەی ئەم فەرموودانە حوکمی مەڕفوعی بۆ دەبێت، چونکە صەحابییەکە ئەگەر وتی فەرمانمان پێکراوە یاخود ڕێگریمان لێکراوە ئەمە حوکمی ڕەفع وەردەگرێت، جا ئەم فەرموودەیە ئەگەرچی لە دەربارەی دەڵێن مەوقوفە و ڕاستیش بێت کە مەوقوفە ئەوا حوکمی مەڕفوعی بۆ هەیە چونکە ناکرێت صەحابییەکە لە خۆیەوە بڵێت (دوو مردارەوە بوومان بۆ حەڵاڵ کراوە) یاخود (ئەمە و ئەمەمان لەسەر حەڕام کراوە)، کەواتە فەرموودەکە هەرچەندە وەك باسکرا کە بە مەوقوفی هاتووە ئەوا حوکمی مەڕفوعی بۆ هەیە هەروەك لە لای زانایانی فەرموودەناس بەم شێوەیەیە، بە هەمان شێوە پێغەمبەر ﷺ لە دەربارەی مردارەوە بوو فەرموویەتی کاتێك پرسیاری لێکرا لە دەربارەی ئاوی دەریا کە ئایا دەستنوێژی لێ بشۆین یان نا ؟ فەرمووی: (هو الطهور ماءه الحل ميتته) – رواه مالك وأصحاب السنن–، واتە: ئاوەکەی پاکە و مردارەوە بووشی حەڵاڵە. الله عز وجل دەفەرموێت: (حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ) وە دەبینین لە سوننەتی پێغەمبەرمان ﷺ کە هەندێك مردارەوە بوو حەڵاڵە بۆمان، کەوایە (وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ)، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تەشریع لە قورئاندا شتێکە و لە سوننەتیشدا دەشێت شتێکی تر بێت.

بەڵگەیەکی تر، الله تعالی لە سوڕەتی (النساء) دوای ئەوەی باسی ئەو ئافرەتانەی کردووە حەڕامن لێیان ﴿ حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمۡ أُمَّهَٰتُكُمۡ وَبَنَاتُكُمۡ وَأَخَوَٰتُكُمۡ وَعَمَّٰتُكُمۡ وَخَٰلَٰتُكُمۡ وَبَنَاتُ ٱلۡأَخِ وَبَنَاتُ ٱلۡأُخۡتِ... ﴿٢٣﴾﴾پاشان دوای ئەمە دەفەرموێت: ﴿...وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمۡ أَن تَبۡتَغُواْ بِأَمۡوَٰلِكُم مُّحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ... ﴿٢٤﴾﴾ ، واتە ئەم چینانە یان ئەو ناوانەی الله عز وجل باسی کردووە بۆ موسڵمان نیە کە هاوسەرگیری بکات لەگەڵ هیچ یەکێکیان، دەبینی کە الله تعالی لە چوارچێوەی ئەم ئافرەتە حەڕامکراوانە لەم ئایەتەدا باسی ئەوەی نەکردووە کە ئایا ئافرەت مارە دەکرێت لەسەر خوشکی باوکی ؟ ئایا ئافرەت مارە دەکرێت لەسەر خوشکی دایکی ؟ [واتە مێردی پووری ئافرەتەکە دەتوانێت ئەو ئافرەتە مارە بکات؟ ]، ئایەتەکە باسی ئەم دوو جۆرە نەکردووە لە حەڕامکراوەکان، بۆیە ئەگەر باسەکە تەنها کورت بکەینەوە لە پەڕتوکی الله عز وجل ئەوا دروستە بۆ پیاو هاوسەرگیری بکات لەگەڵ پووری خێزانەکەی یان ئافرەت مارە بکرێت لەسەر خوشکی باوکی و بە هەمان شێوە ئافرەت مارە بکرێت لەسەر خوشکی دایکی، ئەمە ئەگەر تەنها باسەکەمان کورت کردەوە لەسەر پەڕتوکی پەروەردگارمان، بەڵام ئەوەی هاتووە لە سوننەتی پێغەمبەرمان ﷺ هەروەك ئیمامی موسلیم -رحمه الله- گێڕاویەتیەوە کە ﷺ فەرموویەتی: ( لا تُنكح المرأة على عمتها ولا

على خالتها)، واتە: ئافرەت مارە ناکرێت نە لەسەر خوشکی باوکی و نە لەسەر خوشکی دایکی. کەوابوو ئەمەش تەشریعێکە باس نەکراوە لە ئایەتەکانی حەڕامکردنی هاوسەرگیری لە ئافرەتان، ئەمە تەشریعێکە و بە هەمان شێوە ئەمەش تەشریعێکە.

بەڵگەیەکی تر، الله تعالی لە سورەتی (النساء) لە چوارچێوەی حەڕامکراوەکان لە ئافرەتان لەسەر موسڵمان باسی ئەوەی کردووە کە دەفەرموێت: ﴿...وَأُمَّهَـٰتُكُمُ ٱلَّـٰتِىٓ أَرۡضَعۡنَكُمۡ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَـٰعَةِ... ﴿٢٣﴾﴾ کەوایە لە بابەتی شیرپێدان لەسەر من و تۆش لە پەڕتوکی الله عز وجل حەڕام کراوە کە هاوسەرگیری بکەی لەگەڵ ئەو ئافرەتەی شیری پێداویت و بە هەمان شێوە لەگەڵ کچەکانی ئەم ئافرەتەش کە شیری پێداویت، چونکە ئەمەیان بە دایك لە قەڵەم دەدرێت و ئەمەی تریش بە خوشك، پەڕتوکی پەروەردگارمان باسەکەی کورت کردووەتەوە لەسەر دوو چین لە ئافرەتەکان، دایکەکان و هەروەها کچەکانیش -ئەمە لە پەڕتوکی پەروەردگارمان- بەڵام لە سوننەتی پێغەمبەرمان ﷺ هەروەك لە فەرموودەی عبد الله بن عباس -الله لە خۆی و باوکی ڕازی بێت- لە لای ئیمامی بوخاری -رحمه الله- هاتووە، بە پێغەمبەر ﷺ وترا بۆچی هاوسەرگیری ناکەی لەگەڵ کچی حەمزە -رضي الله عنه-، ئەویش فەرمووی: (لا تحِلُّ لي ، يَحرُم من الرضاعة ما يَحرُم من النسب ، هي بنت أخي من الرضاعة)، واتە: حەڵاڵ نیە بۆم، ئەوەی حەڕامە لە نزیکی و نەسەب ئەوا لە شیرپێدانیش حەڕامە، ئەو کچی برامە لە شیرپێدان. -ئەمە لەفزی ئیمامی بوخارییە- (هي بنت أخي من الرضاعة)، بۆیە دەبینی کە لە پەڕتوکی الله عز وجل دایك و کچ باسکراوە بەڵام کچی برا باس نەکراوە لە پەڕتوکی الله عز وجل، ئەی لە کوێ باسکراوە ؟ لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ باسکراوە، بۆیە ئەمە تەشریعە و ئەمەی تریش هەر تەشریعە.

بەڵگەیەکی تر هەروەك ئیمامی بوخاری و موسلیم -ڕەحمەتی الله عز وجل ـیان لێ بێت- گێڕاویەتیانەوە کە حەدیسی عبد الله بن عمر ـە و دەڵێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێکردین لە ساڵی خەیبەر لە خواردنی گۆشتی گوێدرێژی خۆماڵی)، حەڕامە کەسێك گۆشتی گوێدرێژی خۆماڵی بخوات، ئەگەر بگەڕێی لە حەڕامییتی گۆشتی گوێدرێژ ئەوا لە پەڕتوکی الله عز وجل بە دەق دەستت ناکەوێت بەڵکو لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ هەیە، کەوابوو ئەمە تەشریع و حوکمێکە دەچێتە پاڵ ئەو حوکمانەی لە پەڕتوکی الله تعالی هاتووە.

کەوایە بەم بەڵگانە ئێستا بۆ من و تۆش جێگیر بوو کە پێغەمبەر ﷺ تەشریع دادەنێت وەك گەیاندنێك لە الله عز وجل ـەوە و لەگەڵ ئەمەشدا ناوی نەهاتووە لەم ئایەتەدا (**إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ**) نەیفەرمووە بۆ پێغەمبەرەکەشی، بۆچی ؟

هۆکاری یەکەم: چونکە دانانی تەشریعەکان لە تایبەتمەندێتی الله ـیە -عز وجل- بە تەنها، ئەمە هۆکاری یەکەمە بۆ ناونەهێنانی پێغەمبەر ﷺ لەم ئایەتەدا.

هۆکاری دووەم: ئەوەی بۆمان دێت لە ڕێگەی پێغەمبەرەوە ﷺ دابەش دەبێت بۆ سێ بەش:

*بۆمان هاتووە لە ڕێگەی قورئان، وە پێناسەکەی: دەربڕین و واتاکەی لە الله ـوەیە -عز وجل-

*وە لەویەوە بۆمان هاتووە ﷺ فەرموودە قودسیەکان، وە پێناسەی فەرموودەی قودسی وەك پێناسەی یەکێك لە زانایان: دەربڕین و واتا لە الله عز وجل لەگەڵ جیاوازی هەبوون لە نێوان فەرموودەی قودسی و ئایەتەکانی الله عز وجل لە قورئاندا، بۆیە ئەمەش بە هەمان شێوە لە الله ـوەیە -عز وجل.-

وە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆمان هاتووە،فەرموودەکانی نەبەوی، پێناسەی ئەم فەرموودانەش: دەربڕین لە پێغەمبەرەوەیە ﷺ و واتاکەشی لە الله ـوەیە -عز وجل.-

کەواتە ئێستا بە دەرەنجامێك دەردەچین، قورئان لە الله ـوەیە، فەرموودەی قودسی لە الله ـوەیە، فەرموودەکانی پێغەمبەریش ﷺ واتاکەی لە الله ـوەیە، بۆیە لێرەوە لەبەر ئەم هۆکارە ناوی پێغەمبەر ﷺ نەبراوە لەم ئایەتەدا، چونکە هەموو ئەو گەیاندنانەی هاتووە، هەمووی لە الله ـوەیە -عز وجل-، بەڵگەش لەسەر ئەمە هەروەك لە سوڕەتی (النجم) هاتووە، الله تعالی دەفەرموێت: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝٣ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ۝٤ ﴾ ، واتە: وە قسە و گوفتاری (پێغەمبەر) لە ڕووی هەوا وهەوەسەوە نیە

* ئەمەی کە ڕایدەگەیەنێت تەنها نیگا و وەحی خواییە.

کەوابوو هەموو ئەوەی بۆمان هاتووە بریتییە لە وەحی، بە هەمان شێوە هەروەك ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە ئیمامی أحمد -رحمه الله- گێراویەتیەوە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ألا إنيِّ أُوتيتُ القرآن ومثلهُ معه) واتە: ئاگاداربن و بزانن کە من قورئانم بۆ هاتووە لەگەڵ ئەوەشیان کە هاوشێوەی ئەوە. کەوایە بۆم چەسپا و جێگیر بوو کە پێغەمبەر ﷺ تەشریعەکان دادەنێت وەك گەیاندنێك لە الله ـەوە -عز وجل، هەر بۆیەش ناوی نەهێنراوە لەم ئایەتە پیرۆزەدا( إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ)

کەواتە ئەو دەستکەوت و دەرەنجامەی بەدەستمان دەگات، هەموو ئەوەی باسم کرد جەختکردنەوەیە لەسەر ئەوەی دانانی حوکمەکان لە تایبەتمەندێتی الله ـیە -عز وجل-، هیچ یەکێك لە دروستکراوانی سەربەخۆ نەکردووە لەم تایبەتمەندێتیە و پێی نەداوە تەنانەت بۆ پێغەمبەریش ﷺ.

**ئێستاش دێینەوە سەر لیژنەی نووسینەوەی دەستور،**

ئەوانە تەشریعەکان دادەنێن بەڵام لەژێر ناونیشانی هاوبەشگەری بۆ الله عز وجل، هاتوونە بە

کۆمەڵە تەشریعێکی پێچەوانە و دژ بۆ تەشریعی اللە عز وجل و سەلماندویانە کە ئەوان هاوبەشانێکن بۆ اللە تعالی، چۆن ئەم قسەیە دەسەلمێنیت ؟ ماددەیەك هەیە لە دەستوری عێراقی، سەرنج بدە ئەم ماددەیە چی دەڵێت، ماددەی (١٩ - دووەم) لە قانونی عێراقی، ئەم قانونە یاخود ئەو دەستورەی دەنگی لەسەر دراوە لە ٢٠٠٥ و خەڵکیش وتویانە بەڵێ بۆ دەستور! ، ((ماددەی نۆزدەیەم: دووەم لە دەستوری عێراقی: دەڵێت: هیچ تاوانێك و هیچ سزایەك نیە تەنها بە دەق نەبێت و هیچ سزایەك نیە تەنها لەسەر ئەو کارە نەبێت کە قانون لە کاتی ئەنجامدانیدا بە تاوانی هەژمار دەکات، وە نابێت سزایەك جێبەجێ بکرێت توندتر بێت لە سزایە سەپێنراوەکە لە کاتی ئەنجامدانی تاوانەکە))، ئەمە ماددەیەك، چۆن لە ڕێگەی ئەم مادده قانونیەوە بیسەلمێنین کە لیژنەی نووسینەوەی دەستور خۆیان کردووەتە هاوبەش بۆ اللە تعالی، سەرنجی ئاماژەی یەکەم بدە (هیچ تاوانێك و هیچ سزایەك نیە تەنها بە دەق نەبێت) فەقیهیان هەیە کە پێیان دەڵێن فەقیهەکانی قانون پەنا بە اللە، مانای هیچ تاوانێك و هیچ سزایەك نیە تەنها بە دەق نەبێت ئەوەیە واتە لیژنەی نووسینەوەی دەستور تاوانەکان پۆلێن دەکەن، جا ئەوەی لیژنەی نووسینەوەی دەستور لە دەربارەیدا وتبێتی ئەم کارە بە تاوان هەژمار دەکرێت، ئیتر ئەم کارە بە تاوان هەژمار دەکرێت، بەڵام ئەگەر نەیوتبێت تاوانە ئەوا ئەم کارە لە قانونی عێراقی بە تاوان هەژمار ناکرێت، هەموو ئەو قانونانەی کاریان پێدەکرێت ئێستا لە وڵاتانی موسڵمانان هەموویان لەسەر ئەم ماددەیەن، دوای ئەوە ئەگەر لیژنەی نووسینەوەی دەستور تاوانەکانی دیاریکرد، ئەوا دەسەڵاتی دانانی سزاکانی بەخۆی داوە لەسەر ئەم تاوانە لە ڕووی ئەندازە و لە ڕووی ژمارە و هاوشێوەی ئەمانە، واتە ئەوان جۆری سزاکە هەڵدەسەنگێنن لەسەر ئەم تاوانە.

نموونە لەسەر ئەمە: وازهێنان لە نوێژ تاوان نیە کەواتە هیچ سزایەکی بۆ نیە، قانون سزا نادات چونکە لیژنەی نووسینەوەی دەستور تاوانەکان دیاری دەکەن، بەدڵنیاییەوە ئەگەر بگەڕێیت لە تاوانەکان لە دەستوری عێراقی ئەوا نایدۆزیتەوە کە وازهێنان لە نوێژ تاوان بێت! چونکە لیژنەی نووسینەوەی دەستور وازهێنان لە نوێژ بە تاوان لە قەڵەم نادەن و هەر بۆیەش هیچ سزایەکیان دانەناوە بۆ ئەو کەسەی واز لە نوێژ دەهێنێت، ئەمە نموونەیەك بوو، نموونەیەکی تر "گۆڕینی دین" پیاوێکی موسڵمان پەنا بە اللە دەبێتە ئێزیدی، لە قانونی عێراقی ئەمە بە تاوان هەژمار ناکرێت، بۆچی؟ چونکە دەوڵەتێکی دیموکراسیە و لە پایەکانی دیموکراسیش ئازادی بیروباوەڕە، واتە خەڵکی بە ئارەزوو و ویستی خۆیان دینێك هەڵدەبژێرن، بۆیە لیژنەی نووسینەوەی دەستور "گۆڕینی دینەکان" بە تاوان لە قەڵەم نادات، کەوایە هیچ سزایەك نیە لەسەر موسڵمانێك کە دینەکەی بگۆڕێت یاخود بچێتە سەر دینێکی تر، وە پێغەمبەر ﷺ

دەفەرموێت: (من بدَّل دينه فاقتلوه)[٥] واتە: هەر کەسێك دینەکەی گۆڕی، بیکوژن.
زینا کردن بە تاوان هەژمار ناکرێت تەنها بە چەند مەرجێك نەبێت و دانەرانی ئەم مەرجانەش بریتیین لە لیژنەی نووسینەوەی دەستور ئەوانەی کە دەڵێن: "زینا کردن خودی خۆی تاوان نیە ئەگەر مەرجەکان هاتنەدی، بەڵام ئەگەر مەرجێك لە مەرجەکان نوقسان بوو ئەوا لەو کاتەدا زینا بە تاوان هەژمار دەکرێت."
مەرجی یەکەم -دەڵێن- "دەبێت ئافرەتەکە بالغ و پێگەیشتوو بێت، جا ئەگەر پێگەیشتوو نەبوو و کەسێکیش زینای لەگەڵ کرد ئەوا ئەمە تاوانە، بەڵام ئەگەر پێگەیشتوو بوو پاشان دوای ئەوە زینای کرد ئەوا ئەمەیان بە تاوان هەژمار ناکرێت"، مەرجی یەکەم دەبێت لە ئافرەتەکە بێتەدی.
مەرجی دووەم -دەڵێن- "دەبێت بە ڕەزامەندی خۆی بێت" واتە ئەگەر دەستدرێژی کرایە سەر لەسەر زینا ئەوا ئەمە تاوانە بەڵام ئەگەر ڕەزامەندی خۆی لەسەر بوو و خۆی دا بەدەست ئەو کەسەی دەیەوێت فاحیشەی لەگەڵ بکات ئەوا ئەمەیان لە قانوندا بە تاوان هەژمار ناکرێت.
مەرجی سێیەم -دەڵێن- : "دەبێت لە شوێنێکی گونجاو بێت، وەك ڕەچاوکردنێك بۆ داب ونەریتە گشتییەکان.
کەوابوو دەبێت پێگەیشتوو بێت، بە ڕەزامەندی خۆی، لە شوێنێکی گونجاویش وەك ڕەچاوکردنێك بۆ داب ونەریتە گشتییەکان، هەر بۆیەش لە قانونی میصڕی کە موڕجیئە و ئیخوانی میصڕ حوکمی پێدەکەن لە چوارچێوەی ئەم قانونەدا دەڵێت: "ئەگەر پۆلیس پیاوێك و ئافرەتێکی بینی خەریکی زیناکردن بوون لەناو سەیارەکەیان ئەوا بۆ پۆلیسەکە نیە دەست بدات لە پەنجەرەی سەیارەکەش چونکە حوڕمەتی سەیارە وەك حوڕمەتی ماڵ وایە."
کەوایە ئەی لیژنەکە کەی زینا بە تاوان لە قەڵەم دەدەن؟ سەرنج بدە براکەم، تەنها لە یەك حاڵەتدا ئەگەر هاتوو کرێی وەرگرت لەسەر زیناکە لە کاتێکدا مۆڵەتی نەبێت لە لایەن قانونەوە، ئەگەر ئافرەت زینای کرد و کرێیەکی وەرگرت لەسەر زیناکە و مۆڵەتی ئەنجامدانی پیشەی نەبوو، قانون سزای دەدات نەك لەسەر زیناکەی بەڵکو لەبەرئەوەی پیشەیەك دەکات بەبێ مۆڵەتی قانونیەوە.
ئەمە ئەوەیە کە لیژنەی نووسینەوەی دەستور دایناوە، ئەم قسەیەش لە میصڕ، من جەخت لەسەر میصڕ دەکەمەوە چونکە سەرچاوەی خراپە و شەڕ لە میصڕە، کە مەبەستم میصڕییەکان نییە نەخێر پەرژین بێت لەوان، بەڵکو ئەو فیکرەیەی دەرچووە لەوێدا سەرچاوەی خراپە لەوێیە پەنا بە الله، لە میصڕ "ئیخوانی میصڕ" ناویان ناهێنین بە ئیخوان موسلیمین، ئیخوانی

[٥] رواه البخاري

میصرِ، ئیخوانی قەشەکان، یەکێك لە عەمامە بەسەرەکانیان ناردبوو بۆ پەرلەمانی میصرِی، پیاوەکەش خۆی کاندید کرد بۆ چوونە پەرلەمان، من یادەوەرییەکانی ئەم پیاوەم خوێندەوە چونکە ئەو دوای ئەوە تەوبەی کردبوو، جا دەستی کرد بە سەردانی کردنی خەڵکەکە و ئەوانەش کە دەنگی پێدەدەن بۆ چوونە پەرلەمان، جا لە چوارچێوەی ئەو شوێنانەی سەردانی کرد، چوو بۆ ناوەندێکی پۆلیس، ئەم پیاوە لە یادەوەرییەکانی دا دەڵێت کاتێك چووم بۆ ناوەندی پۆلیسەکە بینیم ژوورێك پڕبوو لە ئافرەت، جا منیش بە بەرپرسی ناوەندەکەم وت "ئەفسەرەکە" : ئەو ئافرەتانە چ کێشەیەکیان هەیە ؟ ، وتی: ئەی شێخ، ئەوانە زیناکەرن، جا منیش ئاوڕی ڕاست و چەپم دایەوە و هیچ پیاوێکم نەبینی، بۆیە وتم: کەوایە پیاوە زیناکەرەکان لە کوێن ؟ ئەگەر ئەمە ئافرەتە زیناکەرەکەیە ئەی پیاوە زیناکەرەکە لە کوێیە ؟ وتی: ئەی شێخ ئایا بیرتان چووە کە ئێوە لە پەرلەمان بڕیارتان داوە کە ئافرەت ئەگەر زینای کرد و کرێیەکی وەرگرت لەسەر زیناکە لە کاتێکدا مۆڵەتی قانونی نیە ئەوا سزا دەدرێت، جا ئەوانە ئەو ئافرەتانەن کە گرتوومانن زینایان کردووە و کرێیان وەرگرتووە لەسەر زیناکە و کاتێکیش پرسیارمان لێکردن لە دەربارەی مۆڵەتی ئەنجامدانی پیشە، نەیانبوو بۆیە هێنامانن و سزایان دەدەین بەپێی قانون! لەو شوێنەوە ئیتر ئەو پیاوە گەڕایەوە لای الله و وازی لە پەرلەمان هێنا و یادەوەرییەکانی خۆی نووسی.

بۆیە لیژنەی نووسینەوەی دەستور کاتێك ئەم تەشریعانە دادەنێت ئایا ئەمە ئەو هاوبەشی و هاوتاییە نیە کە واتاکانیم بۆ باسکردن ؟

کەوابوو هیچ تاوانێك و هیچ سزایەك نیە تەنها بە دەق نەبێت -سەرنجی تەواوکەری ماددەکە بدە- تەواوکەری ناوەڕۆکی ماددەکە: (وە هیچ سزایەك نیە تەنها لەسەر ئەو کارە نەبێت کە قانون لە کاتی ئەنجامدانی بە تاوان هەژماری دەکات)، واتای ئەم بەشە چییە لە ماددەکە؟ هەندێك جار لیژنەی نووسینەوەی دەستور بێئاگان لە هەندێك تاوان، واتە هەندێك تاوان هەیە بەڵام هیچ دەقێکیان نەنوسیوە لەسەر ئەوەی ئەم کارە تاوانە و هیچ سزایەکیان دانەناوە لەسەر ئەم تاوانە و کەسێك دێت و ئەم تاوانەی ئەنجام داوە، قانون هیچ دەقێکی دانەناوە لەسەر ئەو تاوانە و بە هەمان شێوە هیچ سزایەکیش، جا ئایا چی دەوترێت؟ دەڵێین ئەو پیاوەی ئەم تاوانەی ئەنجام داوە بە تاوانبار هەژمار ناکرێت، چونکە تەشریع دانەرەکە بێئاگا بووە لە هەژمارکردنی ئەم کارە بە تاوان پاشان دوای ئەوەش بێئاگا بووە لەوەی سزایەك دابنێت لەسەر ئەم تاوانە، بڕگەی سێیەم لە قانونەکە دەڵێت: (جا ئەگەر تەشریع دانەر داینا دوای ئەوە -واتە

دوای دەرخستنی ئەوەی کە ئەم کارە تاوانە- هەژماری دەکەن لە چوارچێوەی تاوانەکان و سزایەك لەسەر ئەم تاوانە دادەنێن).

کەوایە ئەو کەسەی ئەم تاوانە ئەنجام دەدات پێش ئەم تەشریعە، سزا دەدرێت یان نا ؟ لیژنەی نووسینەوەی دەستور وەك ویژدانییێك لە ڕووی دادپەروەرییەوە دەڵێن: "نەخێر سزا نادرێت" بۆچی ؟ دەڵێت: چونکە پێش ئەوەی ڕوونی بکەینەوە ئەم کارە تاوانە و پێش ئەوەی سزایەکمان لەسەر ئەم کارە دانابێت، ئەو کەسە ئەم کارەی ئەنجام داوە، کەواتە سزای نادەین چونکە کردارەکەی پێش تەشریعی ئێمە کەوت، ئەمە ئەو ماددانەیە کە لیژنەی نووسینەوەی دەستور دەیاننوسێت.

بەڵکو لەمەش خراپتر، ماددەیەك هەیە لە دەستوری عێراقی بڵاوکراوەتەوە و ئەم ماددەیەش لە دوو ڕۆژنامە بڵاوکرایەوە و من ئەم ڕۆژنامەیەم لای خۆم هێشتووەتەوە، ڕۆژنامەیەکە ناوی "دار السلام"ـە هەروەك دەزانن ئەم ڕۆژنامەیە هی کێیە، هی حیزبی عێراقییە، وە ڕۆژنامەیەکی ئەمریکی دەقی دەستوری عێراقی بڵاوکردووەتەوە لە ساڵی ٢٠٠٥، سوپای ئەمریکی مەفرەزەیان دادەنا، خەڵکیان ناچار دەکرد دانەیەك لە ڕۆژنامە ئەمریکییەکە وەربگرن تاوەکو ڕەشنووسی دەستوری عێراقی بخوێننەوە، وە بە هەمان شێوە ڕۆژنامەی (دار السلام) شەرەفی بڵاوکردنەوەی ئەم دەستورەی وەرگرت، وە هیچ سەرنجێکیان نەدا لەسەر ئەو ماددانەی تیایدا بوو بە یەك وشەش، ئەو ماددەیەی تیایدا هەیە دەقەکەی بەم شێوەیەیە بەڵام ژمارەی ماددەکەم بیر نەماوە: (ئەگەر دەسەڵاتی تەشریعی تەشریعێکی دانا، ئەوا بەرزتر دەبێت لە هەر تەشریعێکی تر لە هەر لایەنێکەوە بێت لە کاتی بەریەککەوتن و دژبوونیان)، مەبەست لە دەسەڵاتی تەشریعی لێرەدا "ئەندامانی پەرلەمانە" کەوایە جیا لەوەی ئەوان بوونەتە هاوبەش بۆ الله عز وجل ئەوا بە هەمان شێوە لیژنەی نووسینەوەی دەستور هاوبەشیەتی دەدات بە پەرلەمان، چونکە لە ماوەی چوار ساڵدا لە مافی ئەندامانی پەرلەمانە -کە مافیان نیە لە ڕاستیدا- تەشریع دابنێن بۆ پێشهات و ڕووداوە نوێیەکان، چونکە قانون کورتبین و نوقسانە لەوانەیە شتانێك ڕووبدات لە ماوەی چوار ساڵ و قانونیش بەم شتانەی نەزانیوە کە ڕوودەدەن، ئەندامانی پەرلەمان خۆیان دەستپێشخەری دەکەن لە دانانی تەشریعەکان، کێ ئەم دەسەڵاتەی پێداون ؟ لیژنەی نووسینەوەی دەستور، (ئەگەر دەسەڵاتی تەشریعی تەشریعێکی دانا، ئەوا بەرزتر دەبێت لە هەر تەشریعێکی تر لە هەر لایەنێکەوە بێت لە کاتی بەریەککەوتن و دژبوونیان)، جا ئەم ماددەیە هەیە لە ڕەشنووسەکە، وە هەر کەسێك بگەڕێتەوە بۆ ڕۆژنامەکانی ٢٠٠٥ ئەم قسەیە دەدۆزێتەوە کە باسم کرد لە ڕۆژنامەکە، بەڵام دوای ئەوە کاتێك دووبارە دەستوریان نووسیەوە، ئەم ماددەیەیان سڕییەوە لە دەستور، دەستوری ئێستا ئەم

ماددەیەی تیادا نیە، بەڵام سڕینەوەی ئەم ماددەیە مانای ئەوە نیە ئەم دەسەڵاتدارانە -ئەم تاغوتانە- کار ناکەن بەم ماددەیە، لابراوە بەڵام چالاکە و کاری پێدەکرێت. چۆن ؟

ئەگەر ئێستا کەسانێك بێن و بڵێن دەمانەوێت دەستی دز ببڕین، هەموو ئەندامانی پەرلەمان دژی دەوەستنەوە و ئەو ماددەیەی پشتی پێدەبەستن بریتییە لە ماددەی "١٩ دووەم: هیچ تاوانێك و هیچ سزایەك نیە تەنها بە دەق نەبێت"، ئەوەی قانونی عێراقی دەیڵێت کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دزی تاوانە، دەڵێن تاوانە بەڵام نەیان وتوە سزای دزی کردنەکە دەستبڕینە! ، سزاکەی زیندانی کردنە، بۆیە ئەوان هەرچەندە ئەم ماددەیەیان لادابێت ئەوا ئێستاکە کاری پێدەکەن و بەردەوامیشن لە کارکردن پێی بەجۆرێك هیچ کەسێك بۆی نیە سەرپێچی دەستور بکات، بەڵام کارەساتەکە لە کوێیە ؟ ئەو تەشریعانەی دایانناوە ئەوەیان کردووەتە مەرج تیایدا کە ئەگەر دژیەك بوو لەگەڵ تەشریعێکی تر ئەوا ئەو تەشریعەی پەرلەمان دایدەنێت بەرزتر دەبێت لەو تەشریعە و تەنها لەسەر ئەمەش نەیان بڕاندووەتەوە بەڵکو دەڵێن ((لە هەر لایەنێکەوە بێت))، وێنەکەت بۆ نزیك دەکەمەوە بە نموونەیەك: الله تعالی دەفەرموێت: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٣٨ ﴾[6]، واتە: دەستی پیاوی دز و ئافرەتی دز ببڕن لە پاداشتی کاری ناڕەوایاندا ئەمەش تۆڵەیەکە لە لایەن خواوە، خوا باڵادەست و دانایە.

لیژنەی نووسینەوەی دەستور - کە هاوبەشانێکن بۆ الله عز وجل و دژی ئەون- دەڵێن: (پیاوی دز و ئافرەتی دز زیندانی دەکرێن یان قەرەبووێك دەدەن لە بری دزیەکە، یان زیندان یان سزایەکی ماددی)، ئێستا دژبوون و بەریەککەوتنێك هەیە لە نێوان ئەم شەریعەتە (**وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ**) و شەریعەتی (اسجنوا أو ادفعوا غرامة) جا هەر کاتێك دژبوون هەبوو لە حوکمدا ئەوا شەریعەتی کێ بەرزتر دەبێت ؟ شەریعەتی تاغوت بەرزتر دەبێت لە هەر تەشریعێکی تر، وە لە هەر لایەنێکەوە بێت، باشە، ئەم تەشریعە لە پەروەردگارمانەوەیە، چی دەڵێی ئەی تەشریع دانەر! کەوایە بەهۆی ئەمەوە مانای هاوبەش و هاوتا (الند) بۆت ڕوون دەبێتەوە کە بریتییە لە هاووێنە و هاوشێوە و دژ و پێچەوانە کە کاری ئەسڵەکە دەکات، بۆیە لیژنەی نووسینەوەی دەستور کۆمەڵە خوا و پەرستراوێکن بەڵکو هاوبەشن بۆ الله عز وجل، وەك بڵێی ئایەتەکە لە دەربارەی ئەوان بێت، الله عز وجل بوارێکی نەداوە بۆ ناوهێنانی پێغەمبەرەکەی ﷺ لەم ئایەتەدا بەڵام ئایەتەکە لە دەرەوەی قورئان لە لای ئەوانە هەروەك بەم جۆرەی لێ هاتبێت (حوکم تەنها بۆ لیژنەی دەستورە) و (حوکم تەنها بۆ ئەندامانی پەرلەمانە)

---

[6] [المائدة: ٣٨]

و (حوکم تەنها بۆ هەندێك لە شێخی عەشیرەتەکانە) بۆیە لێرەوە بۆت دەردەکەوێت چۆن ئەم ئایەتە بە بەڵگە دەهێنیتەوە لەسەر ئەوەی لیژنەی نووسینەوەی دەستور هاوبەشانێکن بۆ الله عز وجل.

باسی ئەوەی ماوە لە ئایەتەکە تەواو دەکەین، الله تعالی دوای ئەوە فەرموویەتی: (أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ) وە مانای (تَعۡبُدُوٓاْ) بە واتای (تطیعوا) دێت، واتە فەرمانی کردووە کە گوێڕایەڵی تەنها الله عز وجل بکەن، بەهۆی ئەوەی گوێڕایەڵی کردن (الطاعة) لێرە هاتووە لە چوارچێوەی حاکمیەت، بۆیە بەم شێوەیە لە ئایەتەکە تێدەگەین "أمر ألا تتحاكموا إلا إلى شرعه" (إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ) ئایەتەکە لە باسی حاکمیەتە، دوای ئەوە چی دەفەرموێت؟ (أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ)، واتە: گوێڕایەڵی کەس مەکەن جگە لە الله عز وجل لەو تەشریعانەی داینناوە ، پاشان دوای ئەوە دەفەرموێت: (ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ) وە هەروەك دەزانن کە " ذَٰلِكَ " ناوی ئاماژەیە و ناوی ئاماژەکردنیش پێویستی بە ئاماژەپێکراوێکە، وە لێرەدا ئاماژەپێکراوەکەش بۆ دوو بڕگەیە لە سەرەتای ئایەتەکە (إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ) و (أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ) جا هەر کەسێك دانبنێت بە حاکمیەت بۆ الله عز وجل پاشان حوکم بباتەوە لای شەرعی الله عز وجل، ئەمە ئەوانەن کە الله عز وجل لە دەربارەیان دەفەرموێت (ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ) واتە: ڕاست و دروستە کە هیچ خواری و لارییەکی تیادا نیە "ئەوەی کە دانبنێیت بە حاکمیەت بۆ الله و حوکمیش ببەیتەوە لای شەرعی الله."

بۆیە ئەگەر کەسێك دانبنێت بە حاکمیەتی الله عز وجل و پاشانیش دانبنێت بە حاکمیەت بۆ جگە لە الله عز وجل، بەدڵنیاییەوە ئەمە لەسەر دینی ڕاست و دروست نیە چونکە الله عز وجل فەرموویەتی: (ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ ) واتە هەر کەسێك دانبنێت بە حاکمیەت تەنها بۆ الله نەك بۆ لیژنەی نووسینەوەی دەستور پاشان دانبنێت بە حوکم بردنەوە بۆ لای شەرعی الله تعالی، بەشی کۆتاییش لە ئایەتەکە (وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ )، چی نازانن ؟ واتە ئەو سێ ڕاستییەی باسکرا لە ئایەتەکە

نازانن (إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ)، نازانن (أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ)، نازانن (ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ) ، (وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ )، هەروەك ئاشکرایە کە وتەی الله عز وجل پاکی و بێگەردی بۆی لەوەی پێچەوانەی واقیع بێت، جا ئەگەر ئامارێك بکەیت لەسەر زەوی، دوایین ئامار ئەوەی بزانم (حەوت ملیار و نیو ئینسانە) لە حەوت و نیو، شەش و چارەگی هەموویان لەسەر غەیری ئیسلامن نازانن (إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ)، نازانن (أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ)، نازانن (ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ )، وەرە لەگەڵم بۆ لای ملیار و چارەگەکە چەند لێیان دەزانێت ؟ کەواتە

الله عز وجل ڕاستی فەرمووە، -هەر لە واتای ئایەتەکەدا- "بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم سێ ڕاستییە نازانن."

وە بەهۆی ئەوەی ئەم ڕاستییانە نازانن ئەمە نابێتە ڕێگر لە بەکارهێنانی ناوی شیرك لەسەریان، بەهۆی ئەوەی نازانن نابنە خاوەن عوزر، جا هەر کەسێك بکەوێتە شیرك پێی دەوترێت موشریك، بەڵام جیاوازی دەکرێت لە نێوان ناو و دابەزاندنی حوکم، واتە کەسێك بکەوێتە شیرك پێی دەڵێین موشریك بەڵام ئەرکی سەرشانی من نیە کە هەڵسم بە جێبەجێکردنی حەددی الله عز وجل، ئەمە کاری پێشەوا و کاربەدەستانی موسڵمانانە، بەڵام بابەتی وتنی ناوەکە ئەمە لە دینی منە، کە هەر کەسێك بکەوێتە شیرکەوە پێی دەڵێم موشریك ئەگەرچی نەزانیش بێت، بەڵگە لەسەر ئەمە وتەی الله تعالى ـیە لە سوڕەتی (التوبة) : ﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾ ﴾ ، واتە: خۆ ئەگەر کەسێك لە هاوەڵگەران داوای پەنای لێ کردیت (ئەی پێغەمبەر ﷺ )، ئەوە تۆیش پەنای بدە هەتا گوێی لە فەرموودەکەی الله (قورئان) دەبێت، پاشان بیگەیەنە بەو شوێنەی دەیەوێت و (ماڵ و گیان و ژیانی) تیایدا پارێزراوە، ئەم میهرەبانیە لەبەر ئەوەیە ئەوانە کەسانێکن نازانن.

جا پێی وتن موشریك سەرەڕای ئەوەی لە کۆتایی ئایەتەکە فەرمووی (لَّا يَعْلَمُونَ )، کەوایە ئەوەی بکەوێتە شیرکەوە پێی دەوترێت موشریك تەنانەت ئەگەر نەزانێت چونکە عوزری نەزانین نیە لە بنەما و بنچینەکانی عەقیدە.

خەڵکی لەبەردەم ئەم ئایەتە پیرۆزەدا ﴿ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾[٧] دابەش دەبن بۆ سێ چین..

بەشی یەکەم: ئەوانەن کە داندەنێن بە حاکمیەتی الله عز وجل و حوکم دەبنەوە بۆ لای شەرعی الله تعالى ئەوانە ئیماندارن و لەسەر دینی ڕاست و دروستن بە شایەدی الله عز وجل (ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ).

چینی دووەم: داندەنێن بە حاکمیەتی الله عز وجل و بە هەمان شێوە داندەنێن بە حاکمیەت بۆ لیژنەی نووسینەوەی دەستور ئەوانە موشریکن، وە جۆری شیرکەکەشیان بریتییە لە شیرکی گوێڕایەڵی کردن، وە ئەو ئیمانەش کە بانگەشەی دەکات ئەوا تەنها گومان و بۆچوونی خۆیەتی، ئەو ئیمانەی کە گوایە هەیەتی بە الله بەوەی حوکم بۆ ئەوە، ئەمە بۆچوون و گومانی خۆیەتی، بەڵگەش لەسەر ئەمە وەك لە سوڕەتی (النساء)دا هاتووە، الله تعالى دەفەرموێت: ﴿

[٧] یوسف: ٤٠

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾﴾ واتە: ئایا نەتڕوانیووەتە ئەو (دووڕووانەی) لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە بەڕاستی باوەڕیان هێناوە بەوەی کە بۆ تۆ ڕەوانەکراوە و بەوەش کە پێش تۆ ڕەوانەکراوە کەچی دەیانەوێت ڕووبکەنە تاغوت تا دادوەریان لە نێواندا بکەن و چارەسەری کێشەکانیان بکەن، لە کاتێکدا بەڕاستی فەرمانیان پێدراوە کە باوەڕیان بە (تاغوت) نەبێت، شەیتانیش دەیەوێت گومڕایان بکات بە گومڕاییەکی دوور و بێ سنوور.

کەوابوو ئەوەی دانبنێت بە حاکمیەت بۆ الله عز وجل پاشان دانبنێت بە حاکمیەت بۆ جگە لەو و لە کاتێکدا بانگەشەی ئیمان هەبوونیش بکات ئەوا بۆ ئەم جۆرە کەسانە الله عز وجل دەفەرموێت تۆ تەنها پێت وایە کە ئیمانداریت، تۆ وا گومان دەبەیت، وە هەروەك دەزانن کە (الزعم) درۆ و ناڕاستترین قسەیە کە بریتییە لەوەی ئینسان بانگەشەی شتێك بکات کە لەلای نیە، ئەمەش چینی دووەم لە ئاست ئەم ئایەتە.

چینی سێیەم: ئەوانەن کە دان نانێن بە حاکمیەتی الله عز وجل و حوکمیش نابەنەوە بۆ لای شەرعی الله، ئەوانە کافرەکانن پەنا بە الله.

أقولُ قولي هذا و أستغفر لِي ولكُم وَجزاكُم الله خير الجزاء وبارك فيكُم

## لە وتارێکانی
## شێخ ئەبی عەلی ئەنباری -اللە تعالی لێی وەربگرێت

پێشکەش کراوە
لە ڕۆژی دووشەممە ١٠ - موحەڕەم - ١٤٣٥ لە بەرامبەر ٣-١١-٢٠١٤

## وەرگێڕانی
## پێگەی ڕاستەڕێ

